**ناوی کتێب: کتاب الصفات للدارقطني ( به کوردی )**
**وەرگێڕانی: زانا الكردي**
**ژمارەی لاپەڕە: ٣٨**

## تێبینی:

تەنها مەتنی فەرموودە و ئەثەرەکانمان هێناوە بۆ ئەوەی زۆر درێژ نەبێتەوە جا بۆ گەڕانەوە بۆ ئیسنادەکان دەتوانن سەیری کتابەکە بە عەرەبی بکەن.

## سوپاس و پێزانین

زۆر سوپاسی یەکە بە یەکەی ئەو کەسانە دەکەم کە بە یەک وشەش بێ هاوکاریان کردووم تا ئەم کتابەی ئیمامی ( الدارقطني ) بکەینە کوردی و هەڵەو کەم و کوڕییەکانیان بۆ چاک کردم تا سوودێکی عەقیدەیی هەبێت بۆ ئەوانەی دەیخوێننەوە و لەسەر ڕێڕەوی ئەهلی سوننە عەقیدەیان دابمەزرێنن ، الله تعالی پاداشتی هەموویان بداتەوەو بەردەوامیان پێ ببەخشێ لەسەر ڕێگای ڕاستی ئیسلامەتی و لەسەر مەنهەجێکی ڕاست و دروست ، وە الله تعالی لە ئێمەشی قەبوڵ بکات و بیکاتە توێشوویەک بۆ قیامەتمان لەگەڵ هەموو ئەو برا بەڕێزانەدا ، آمین.

## پێشەکی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الحمدلله ، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه أجمعين ، أما بعد:

لەبارەی سیفاتەکانی الله تعالی وە:
ئیمامی نعیم بن حماد ( ٢٢٨هـ) دەفەرمویێت: هەرکەسێ الله بشوبهێنێ بە شتێک لە دروستکراوەکانی، ئەوا کافرە، وە هەر کەسێ ئینکاری ئەوە بکات کە الله وەسفی نەفسی خۆی پێ کردووە ئەوا کافرە، ئەوەی الله وەسفی نەفسی خۆی پێ کردووە وە پێغەمبەرەکەی وەسفی کردووە شوبهاندن نییە.
شرح أصول الإعتقاد أهل السنة للالكائي (٩٣٦).

هەر بۆیە لەم کتابەدا ئیمامی الدارقطني باسی دیارترین سیفاتەکانی الله تعالی ی کردووە، وە لە دوای باسکردنی سیفاتەکان عەقیدەی سەلەف باس دەکات لە ڕووی وەرگرتنی سیفاتەکانی الله تعالی کە چۆن وەریان گرتووە و چیان لەسەری گووتووە، جا بۆیە ئەم کتابە کتابێکی کورت و پوخت و گرنگە بۆ طالب العلم کە لێوەی فێری تەوحیدی ( أسماء والصفات ) ببێت و خۆی بپارێزێ لە گرووپە گومڕاکانی وەک: ( ئەشعەریەکان و جەهمیەکان و موعتەزیلەکان ) کە لایان داوە لە بابەتی أسماء والصفات و گومڕاو سەرلێشێواو بوون، جا بۆیە تۆ کە سەرەتاتە ئەم کتابە کتابێکی زۆر باشە کە لێوەی فێری سیفاتە دیارەکانی الله تعالی ببیت و چۆنیەتی وەرگرتنی بزانیت لە لایەن ئەهلی سوننەوە و خۆت بپارێزی لەو کەسانەی کە تەئویلی باتڵ و نادروست بۆ سیفاتەکان دەکەن و خۆیان و خەڵکیش گومڕا دەکەن، جا بۆیە لەم کتابەدا ئیمامی الدارقطني بە دیاری کراوی باسی سیفاتەکانی

( القدمين، اليدين، الأصابع، الضحک، الصورة، الحثيات ) ی کردووە، کە ئەمانە دیارترین سیفاتەکانی الله تعالی یە، وە ئیمام تەنها فەرموودەی هێناوە بۆ جێگیر کردنی ئەم سیفەتانە و لە کۆتاییش باسی مەنهەجی سەلەفی کردووە لە وەرگرتنی سیفاتەکاندا و جوان ڕوونی کردووەتەوە دوور لە ( تحريف - تشبيه - تمثيل - تكيف – تعطيل ) سیفاتەکان جێگیر دەکەین وەک ئەهلی سوننە بەبێ هیچ یەکێک لەمانە هەر وەک ئەوەی سەلەف جێگیریان کردووە، لەگەڵ باسکردنی ئەم سیفاتە دیارانەدا لەناو فەرموودەکاندا سیفاتی تریش لە خۆ دەگرێت وەک: ( العلو، الكلام، العلم، القدرة، الإرادة، السمع، البصر ... ) کە ئەم سیفاتانە بە عەقڵ و فیترەتیش دەزانرێ بۆیە هیچ عوزر لە خۆ ناگرێ کەسێک بەمانە جاهیل بێت ئەوە بەڕاستی الله ی نەناسیوە، بۆیە پێویستە لە بابەتی ( سیفاتەکانی الله تعالی ) زۆر ورد بیت بۆ ئەوەی نەکەویتە هەڵەوە و توشی کوفر نەبیت جا ئەوەی ئەهلی سوننە وتویانە ئەوە بڵێیت و لەو شوێنە بوەستی کە ئەوان لێی وەستان، الله تعالی ئەم کتابە بکاتە ڕێخۆشکەرێک بۆ فێربوونی تەوحیدی أسماء والصفات و دوور کەوتنەوە لە گرووپە تیاچووەکان، آمین.

## كورتەیەك لە ژیانی ئیمامی ( الدارقطني – ٣٠٦ - ٣٨٥ هـ )

ناوی تەواوی: ئیمام الحافظ أبو الحسن علي بن عمر بن أحمد بن مهدي بن مسعود بن النعمان بن دينار بن عبدالله البغدادي، ناسراوە بە ( الدارقطني ) لە دار القطن لە بەغداد لە ساڵی (٣٠٦هـ) لە دایک بووە، خوێنەر و فەرموودەناس و زماننناس و ئەدیب بوو، خاوەنی چەندین بابەتە لە بواری ( علوم القرآن – والحديث ).
لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسیەکاندا ژیاوە و لەسەر ڕێڕەوی ئەهلی سوننە و جەماعە ڕۆشتووە و مەزهەبی فیقهی شافعی بووە.

لە سەردەمی ئیمامی الدارقطني لە عێراق شێخی ئیسلامی زۆری لێ بووە بۆیە عیلمی لەوان وەرگرتووە و لێوەی نوسیونەتەوە، هەروەها بۆ بەدەست خستنی عیلمی شەرعی سەردانی شام و مصری کردووە.

## مامۆستاکانی ئیمام

١- الحافظ الحجة المعمر، مسند العصر أبو القاسم عبدالله بن محمد بن عبد العزيز بن المرزبان البغوي (ت - ٣١٧هـ).

٢- القاضي الإمام المحدث الثقة، مسند الوقت، أبو عبدالله الحسين بن إسماعيل بن سعيد الضبي البغدادي (ت - ٣٣٠هـ).

٣- الإمام الحافظ الثقة القدوة محمد بن مخلد بن حفص أبو عبدالله الدوري ثم البغدادي (ت - ٣٣١هـ).

٤- الإمام المقرئ النحوي، شيخ المقرئين، أبو بكر أحمد بن موسى ابن العباس بن مجاهد البغدادي (ت - ٣٢٤هـ).

٥- الإمام الحافظ اللغوي، ذو الفنون، أبو بكر بن القاسم بن بشار بن الأنباري (ت - ٣٢٨هـ).

## هەندێك لە خوێندكارەكانی

١- أبو عبدالله محمد بن عبدالله الحاكم النيسابوري (ت - ٤٠٥هـ). من كبار المحدثين. اشتهر بكتابه المستدرک على الصحيحين.

٢- أبو محمد عبد الغني بن علي بن سعيد بن بشر الأزدي المصري (ت - ٤٠٩هـ).

٣- أحمد بن عبدالله بن أحمد بن إسحاق بن موسى المهراني الأصبهاني (ت - ٤٣٠هـ).

## له كتێب و نووسراوەکانی ئیمام

١- المُجْتَبىٰ من السُّنن المأثورة عن النبيّ صلى اللّٰه عليه وسلَّم، والتَّنْبيه على الصحيحِ منها والسَّقيم، واختلاف النَّاقلين لها في ألفاظها.

٢- علل الحديث.

٣- المؤتلف والمختلف.

٤- التتبع.

٥- الإلزامات.

٦- الأحاديث التي خولف فيها إمام دار الهجرة مالك بن أنس.

٧- أحاديث موطأ مالک، واتفاق الرواة عن مالک، واختلافهم فيه، وزيادتهم ونقصانهم.

٨- كتاب الصفات وكتاب الرؤية.

عەقیدەی ئیمامی الدارقطني زۆر بە ڕوونی دیارە لە کتابەکانی وەک (کتاب الرؤية) وە (کتاب الصفات)، الذهبي لە (سير أعلام النبلاء) دەربارەی دەڵێ: پیاوێک بووە هەرگیز نەچووەتە ناو عیلمی کەلام و جیدال کردنەوە، وە شەڕە قسەی نەکردووە تێیدا، بەڵکو کەسێکی سەلەفی بووە. وە ڕیوایەت کراوە لە الدارقطني کە گووتویەتی: هیچ شتێک نییە ڕقم لێی بێتەوە هاوشێوەی عیلمی کەلام.

لەو وتانەی کە ئیمامی الدارقطني هێناویەتی دەربارەی جێگیر کردنی سیفاتەکانی الله تعالی لە (کتاب الصفات)، ئەوەیە کە دەڵێ: ئەم فەرموودانە صحیحن هەڵیان گرتووە هاوەڵانی فەرموودە وە فوقەهاکان هەندێکیان لە هەندێکی تریان، وە ئەمە لای ئێمە حەق و ڕاستە هیچ گومانێکی تێدا نییە، بەڵام ئەگەر گووترا: چۆن الله پێی دەخاتە ناو دۆزەخ، وە چۆن پێدەکەنێت ؟ پێیان دەڵێین: تەفسیری ئەمە ناکەین وە نەشمان بیستووە هیچ یەکێک تەفسیری بکات.

ئیمامی الدارقطني لە ساڵی (٣٨٥هـ) لە تەمەنی (٧٩) ساڵیدا لە بەغداد وەفاتی کردووە، لە گۆڕستانی (باب الدير) نێژراوە.

## دەستپێکی کتابەکە ...

## جێگیرکردنی ( دوو پێی الله تعالی )

١- له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ئەویش لە رسول الله (ﷺ) کە فەرمووی: (خەڵکی) هەڵدەدرێتە ناو ئاگر و دەڵێ: ئایا زیاتر هەیە ؟ تا (الله) **لاقی** یان **پێی** دەخاتە ناوی ئینجا دەڵێ قط قط.

قط قط: واتە بەسە بەسە.

٢- لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: (خەڵکی) هەڵدەدرێنە ناو ئاگرەوە و دەڵێ ئایا زیاتر هەیە ؟ ، تا (الله) **لاقی** - یان گووتی: **پێی** - دەخاتە ناوی ، جا دەڵێ: بەسە بەسە.

٣- لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، لە رسول الله (ﷺ) فەرمووی: (خەڵکی) هەڵدەدرێنە ناو ئاگرەوە، (دۆزەخ) دەڵێ: ئایا زیاتر هەیە ؟ ، تا (الله تعالی) **لاقی** یاخود **پێی** دەخاتە ناوی ، جا (دۆزەخ) دەڵێ: بەسە بەسە.

٤- لە أبي هريرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: بەهەشت و ئاگر (دۆزەخ) دەمەقاڵێیان کرد، ئاگر گووتی: خۆ بەزلزان و لەخۆباییەکان دێنە ناو منەوە، وە بەهەشتیش گووتی: لاوازەکان لە خەڵکی و ڕەشوڕوتەکان دێنە ناو منەوە، جا الله جل وعز بە ئاگری فەرموو: تۆ سزای منی، هەر کەسێکم بوێ توشتی دەکەم، وە بە بەهەشتیشی فەرموو: تۆ ڕەحمەتی منی هەر کەسێکم بوێ توشتی دەکەم، وە بەشی هەر یەکێکتان پڕ بەخۆیەتی (لە دروستکراوەکانی الله) وە گەر ڕۆژی قیامەت بێت الله عز وجل زوڵم لە هیچ یەکێک لە دروستکراوەکانی ناکات.

وه (خەڵکی) هەڵدەدرێنە ناو ئاگرەوە، جا (دۆزەخ) دەڵێ: ئایا زیاتر هەیە ؟ تا (الله) تبارك وتعالى **پێی** دەخاتە سەری، جا لەوێدا پڕ دەبێت و هەندێکی پەنگ دەخواتەوە بەسەر هەندێکیدا، دواتر دۆزەخ دەڵێ: بەسە بەسە.

٥- لە ئەبی کەعب ـەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) گووتی: رسول الله (ﷺ) فەرمووی: جەهەننەم داوای زیاتر دەکات، هەتاوەکو (الله) **پێی** دەخاتە ناوی و جا خەڵکی ناو ئاگرەکە پەنگ دەخۆنەوە و جا جەهەننەمیش دەڵێ: بەسە بەسە.

٦- لە ئەبی هریرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ئەویش لە رسول الله (ﷺ) وەک ئەو فەرموودەیەی أبو سلمة بۆی گێڕاینەوە، لە ئەبی سەعیدی الخدری ئەویش لە رسول الله (ﷺ) فەرمووی: بەهەشت و ئاگر (دۆزەخ) شانازیان دەکرد بەسەر یەکتریدا و، ئاگر (جەهەننەم) گووتی: خۆ بەزلزان و پاشاکان و زەنگینەکان دێنە ناو منەوە، وە بەهەشتیش گووتی: هەژاران و بێ نەوایان دێنە ناو منەوە، الله عز وجل بە دۆزەخی فەرموو: تۆ سزای منی، هەر کەسێکم بوێ توشتی دەکەم، وە بە بەهەشتیشی فەرموو: تۆ ڕەحمەتی منی کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە، وە بەشی هەر یەکێکتان پڕ بە خۆیەتی (لە دروستکراوەکانی الله)، ئەمما ئاگر (خەڵکی) هەڵدەدرێتە ناویەوە و دەڵێ: ئایا زیاتر هەیە ؟ سێ جار وا دەڵێت، هەتا الله تبارك وتعالى دێتە لای و **پێی** لەسەر دادەنێ، ئەوجا پەنگ دەخواتەوە و دەڵێ: بەسمە بەسمە، بەڵام أبو هريرة گووتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: قط قط (واتە بەسە بەسە).

٧- له أبي هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، به هه‌مان شێوه‌ی ئه‌م حدیثه‌ی حماد ، له عطاء بن السائب، له عبيدالله بن عبدالله بن عتبة، له ئه‌بی سه‌عید، که رسول الله (ﷺ) فه‌رمووی: (به‌هه‌شت و دۆزه‌خ شانازیان ده‌کرد به‌سه‌ر یه‌کتریدا)، دواتر وه‌ک ئه‌وه‌ی باس کرد. [ واته وه‌ک فه‌رمووده‌ی پێشووی باس کرد ].

٨- حدثنا محمد بن مخلد، وابو طالب الحافظ، احمد بن نصر قال: حدثنا محمد بن غالب بن حرب، حدثنا عبدالرحمن بن سلام القريشي، حدثنا حماد بن سلمة، عن يونس بن عبيد، عن محمد بن سيرين، له أبي هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، گووتی: (جه‌هه‌ننه‌م) ده‌ڵێ ئایا زیاتر هه‌یه ؟

٩- له أبي هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) ئه‌ویش له رسول الله (ﷺ) فه‌رمووی: هێشتا جه‌هه‌ننه‌م (خه‌ڵکی) هه‌ڵده‌درێته ناوی، جا ده‌ڵێ ئایا هی زیاتر هه‌یه ؟ هه‌تاوه‌کو الجبار (الله) تبارك وتعالى **پێی** ده‌خاته ناوی و جا له‌وێدا په‌نگ ده‌خواته‌وه و ده‌ڵێ قط قط (به‌سه به‌سه).

١٠- له أبي هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) له پێغه‌مبه‌ره‌وه (ﷺ) فه‌رمووی: به‌هه‌شت و دۆزه‌خ شانازیان ده‌کرد به‌سه‌ر یه‌کتریدا و جه‌هه‌ننه‌م گووتی: خۆ به‌زلزان و له‌خۆباییه‌کان و زه‌نگینه‌کان ده‌خرێنه ناو منه‌وه، وه به‌هه‌شتیش گووتی: ئه‌ی من چی که‌س ناخرێته ناو منه‌وه لاوازه‌کان له خه‌ڵکی و ڕه‌شوڕوته‌کان نه‌بێ، الله عز وجل به به‌هه‌شتی فه‌رموو: تۆ ڕه‌حمه‌تی منی به تۆ ڕه‌حم به هه‌ر که‌سێک ده‌که‌م که بمه‌وێ له به‌نده‌کانم، وه به دۆزه‌خیشی فه‌رموو: تۆ سزای منی، به تۆ سزای هه‌ر که‌سێک ده‌ده‌م که بمه‌وێ له به‌نده‌کانم، وه به‌شی هه‌ر یه‌کێکتان پڕ به خۆیه‌تی،

بەڵام ئاگر پڕ نابێت، جا **پێی** دەخاتە سەری ئەوجا دەڵێ بەسە بەسە، وە پەنگ دەخواتەوە و کۆمەڵێکی دەکەونە سەر کۆمەڵێکی تری.

أخرجه مسلم بن الحجاج، عن محمد بن رافع عن شبابة، عن ورقاء، هكذا.

١١- لە أبي هريرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) گووتی: بیستم رسول الله (ﷺ) دەیفەرموو: (خەڵکی) هەڵدەدرێتە ناو ئاگرەوە و، وە ئاگر (دۆزەخ) دەڵێ: ئایا زیاتر هەیە ؟ دوو جار، هەتا الله تبارک وتعالى دێت بۆ لای جا **پێی** دەخاتە ناویەوە، وە پەنگ دەخواتەوە و دەڵێ: قط قط (بەسە بەسە).

١٢- لە أبي سعيد الخدري (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ئەویش لە رسول الله (ﷺ) فەرمووی: بەهەشت و دۆزەخ دەمەقاڵێیان کرد، و ئاگر گووتی: پەروەردگارم خۆبەزلزان و پاشاکان و زەنگینەکان دێنە ناو منەوە، وە بەهەشتیش گووتی: پەروەردگارم هەژارەکان و لاوازەکان لە خەڵکی و ڕەشوڕوتەکان دێنە ناو منەوە، جا الله بە ئاگری فەرموو: تۆ سزای منی، هەر کەسێکم بوێ توشتی دەکەم، وە بە بەهەشتیشی فەرموو: تۆ ڕەحمەتی منی کە هەموو شتێکی گرتووەتەوە، وە بەشی هەر یەکێکتان پڕ بە خۆیەتی، بەڵام ئاگر هەر (خەڵکی) هەڵدەدرێتە ناوی جا دەڵێ: ئایا زیاتر هەیە؟ سێ جار، هەتا الله تبارک وتعالى دێتە لای، جا **پێی** لەسەری دادەنێت، ئەوجا پەنگ دەخواتەوە و دەڵێ: بەسمە بەسمە.

## جێگیرکردنی ( دوو دەست بۆ الله تعالى )

١٣- له أبي هريرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، له پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: **دەستی ڕاستی** الله پڕەو بەخشین لێی کەم ناکات، بینیوتانە چی بەخشیوە لەو کاتەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە ؟ جا هیچ لەوەی لە **دەستی ڕاستی** کەمی نەکردووە.
وە فەرمووی: وە عەرشەکەی لەسەر ئاوە، وە تەرازووی هەڵگرتووە بە **دەستەکەی تری** نزم دەکاتەوە و بەرز دەکاتەوە.

١٤- له عبدالله بن عمر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ئەویش له رسول الله (ﷺ) کە فەرموویەتی: الله عز وجل یەکەم شت دروستی کرد قەڵەم بوو، جا بە **دەستی ڕاستی** گرتی - **کە هەردوو دەستی الله ڕاستن** - ئەوەی لە دنیادا دروست دەبێ نووسی لە کردەوەیەکی کارپێکراو، چاکە بێ یان سەرەڕۆیی، تەڕ بێ یان وشک، لەلای خۆی تۆماری کرد لە الذکر (لێرەدا مەبەست پێی اللوح المحفوظ ـە) جا گووتی بخوێننەوە گەر ویستتان ﴿هَـٰذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ [الجاثِية : ٢٩].

واتە: ئەمە پەڕاوەکەمانە بەڕاستی لەسەرتان دەدوێت بەڕاستی ئێمە وەک خۆی لەبەرمانگرتووەتەوە (کۆپیمان کردووە) ئەوەی کە ئێوە دەتانکرد. / جا ئایا لەبەرگرتنەوە ئیللا لە شتێک نییە کە تەواو بووبێت.

[ واتە هەموو شتێک نوسراوە و براوەتەوە لە قەدەری الله تعالى ، والله اعلم ].

١٥- له أبي هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، له پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: کاتێک الله سبحانه وتعالى دروستکراوەکانی دروستکرد، له کتێبێک نووسی کە لەلایەتی لەسەر عەرش: بەڕاستی ڕەحمەتەکەم بەسەر تورەبوونەکەم زاڵبووە.

١٦- له أبي هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، له پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: کاتێک الله عز وجل دروستکراوەکانی دروستکرد، بە **دەستی** خۆی لەسەر خۆی نووسی، بەڕاستی ڕەحمەتەکەم زاڵ دەبێت بەسەر توڕەییەکەمدا.

١٧- حدثنا أبو صالح الأصبهاني عبدالرحمن بن سعيد، أخبرنا عقيل بن يحيى، حدثنا سفيان بن عيينة قال: قال أبو الزناد: عن الأعرج، له أبي هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فەرمووی: رسول الله (ﷺ) فەرموویەتی: الله عز وجل فەرمووی ئەی نەوەی ئادەم ببەخشە پێت دەبەخشم، چونکە **دەستی ڕاستی** الله پڕە و بەردەوام بەخشەرە، هیچ شتێک لێی کەم ناکا شەو و ڕۆژ.

أخرجة مسلم في الزكاة، عن زهير، و أبي نمير، عن سفيان بن عيينة.

١٨- له أبو موسى (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، فەرمووی: رسول الله (ﷺ) فەرموویەتی: الله عز وجل **دەستی** ڕادەخات بۆ تاوانکاری شەو تا بە ڕۆژ تەوبە بکات، وە بۆ تاوانکاری ڕۆژ تا بە شەو تەوبە بکات، هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت. [ واتە تا ئەو کاتە تەوبە وەردەگیرێ دوای ئەوە تەوبەکردن سوودی نابێ، والله اعلم ].

أخرجه مسلم، في كتاب التوبة، عن أبي موسى عن غندر [و] عن بندار، عن أبي داود، كلاهما عن شعبة [عن] عمرو.

## جێگیرکردنی ( پەنجە بۆ الله تعالی )

١٩- لە عبدالله (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فەرمووی: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ).
وە الزعفراني دەڵێ: پیاوێک لە ئەهلی کتاب هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێی گووت: ئەی باوکی قاسم ئایا پێت گەیشتووە کە الله تعالی دروستکراوەکان لەسەر **پەنجەیەک** هەڵدەگرێ، وە ئاسمانەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە زەمینەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دارو درەخت لەسەر **پەنجەیەکی**، و خۆڵی شێداریش لەسەر **پەنجەیەکی** ؟
گووتی: رسول الله (ﷺ) پێکەنی تا ددانە چوارینەکانی دەرکەوت.
گووتی: الله تعالی ئەم ئایەتەی دابەزاند: { وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ } هەتا کۆتایی ئایەتەکەی خوێندەوە ... [سورة الزمر :٦٧].

واتە: خوانەناسان؛ قەدری الله یان وەک پێوست نەگرت، ڕێزیان بۆ دانەنا، وە هەموو زەوی گرتووە بە دەستی لە ڕۆژی قیامەتدا.

٢٠- لە عبدالله (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فەرمووی: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) لە ئەهلی کتاب پێی گووت: ئەی باوکی قاسم پێت گەیشتووە کە الله عز وجل ئاسمانەکان هەڵدەگرێت لەسەر **پەنجەیەکی**، وە زەمینەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دروستکراوەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دارو درەخت لەسەر **پەنجەیەکی**، وە خۆڵی شێداریش لەسەر **پەنجەیەکی**.

پێغەمبەر (ﷺ) پێکەنی هەتا ددانە چوارینەکانی دەرکەوت، وە الله عز وجل ئەم ئایەتەی دابەزاند: { وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ } [سورة الزمر: ٦٧].

واتە: خوانەناسان؛ قەدری الله یان وەک پێوست نەگرت، ڕێزیان بۆ دانەنا، وە هەموو زەوی گرتووە بە دەستی لە ڕۆژی قیامەتدا.

وە جریر لە فەرموودەکە دەڵێ: وە چیاکان و دارو درەخت لەسەر **پەنجەیەکی**، وە ئاو و خاک لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دروستکراوەکانی تر هەمووی لەسەر **پەنجەیەکی**.

٢١- الأعمش گووتی: بیستم إبراهیم دەیگووت: بیستم علقمة، دەیگووت: عبدالله (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فەرمووی: پیاوێک لە ئەهلی کتاب هات بۆ لای رسول الله (ﷺ) پێی گووت: ئەی باوکی عبدالله: بێگومان الله عز وجل ئاسمانەکان هەڵدەگرێت لەسەر **پەنجەیەکی**، وە زەمینەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە چیاکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دارو درەخت و خۆڵی شێدار لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دروستکراوەکانی تر لەسەر **پەنجەیەکی**، پاشان دەفەرمووێ: من پادشام، من پادشام (أنا الملک).
گووتی: پێغەمبەرم (ﷺ) دیت پێکەنی تا ددانە چوارینەکانی دەرکەوت پاشان فەرمووی: { وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ } [سورة الزمر: ٦٧].

٢٢- لە عبدالله (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فەرمووی: پیاوێک لە ئەهلی کتاب هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێی گووت: ئەی باوکی قاسم، پێت گەیشتووە کە الله تعالی ئاسمانەکان لەسەر **پەنجەیەکی** دادەنێ، وە زەمینەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دروستکراوەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە چیاکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە خۆڵی شێدار

لەسەر **پەنجەیەکی**، پێغەمبەر (ﷺ) پێکەنی هەتا ددانە چوارینەکانی دەرکەوت، جا الله عز وجل ئەم ئایەتەی دابەزاند: { وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ } [سورة الزمر: ٦٧] الآية.

٢٣- لە عبدالله (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فەرمووی: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) پێی گووت: ئەی باوکی قاسم، ئایا پێت گەیشتووە کە الله تعالی دروستکراوەکان لەسەر **پەنجەیەکی** هەڵدەگرێت، وە ئاسمانەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە زەمینەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دارو درەخت لەسەر **پەنجەیەکی**، وە خۆڵی شێدار لەسەر **پەنجەیەکی**؟ رسول الله (ﷺ) پێکەنی، جا الله عز وجل ئەم ئایەتەی دابەزاند: { وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ } [سورة الزمر :٦٧].

٢٤- لە عبدالله (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فەرمووی: الحبر [زانایەکی یەهود] هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) پاشان باسی کرد بەهەمان شێوە، وە لە کۆتاییدا گووتی: { تعالى عما تشركون } الأعمش بە تاء خوێندیەوە.

وكذلك رواه عيسى بن يونس، وقيس بن الربيع عن الأعمش بهذا الإسناد.

٢٥- لە عبدالله (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فەرمووی: یەهودییەک هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) پێی گووت: ئەی محمد بێگومان الله ئاسمانەکان لەسەر **پەنجەیەکی** هەڵدەگرێت، وە زەمینەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە چیاکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دارو درەخت لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دروستکراوەکانی تر لەسەر **پەنجەیەکی**، پاشان دەفەرموێت: من پادشام (أنا الملك)، گووتی: رسول الله (ﷺ) پێکەنی هەتا ددانە چوارینەکانی دەرکەوت وە فەرمووی: { وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ } [سورة الزمر: ٦٧].

يحيى گووتی: وە زیادەیەک هەیە لە فضيل بن عياض، لە منصور، لە إبراهيم، لە عبيدة، لە عبدالله (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فەرمووی: پێکەنینی رسول الله (ﷺ) لە سەرسوڕمانی و بەڕاستدانانا بوو.

٢٦- لە عبدالله بن مسعود (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فەرمووی: یەهودییەک هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) پێی گووت: ئەی محمد بێگومان الله عز وجل ئاسمانەکان هەڵدەگرێت لەسەر **پەنجەیەکی**، وە زەمینەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە چیاکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دارو درەخت لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دروستکراوەکانی تر لەسەر **پەنجەیەکی**، پاشان دەفەرموویێت: من پادشام (أنا الملك)، گووتی: رسول الله (ﷺ) پێکەنی هەتا ددانە چوارینەکانی دەرکەوت، پاشان فەرمووی: { وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ } [سورة الزمر: ٦٧].

يحيى گووتی: وە زیادەیەک هەیە لە فضيل بن عياض، بە هەمان إسناد: ( پێکەنینی رسول الله (ﷺ) لە سەرسوڕمانی و بەڕاستدانانا بوو ).

٢٧- لە عبدالله (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فەرمووی: پیاوێک لە ئەهلی کتاب هات بۆ لای رسول الله (ﷺ) پێی گووت: بێگومان الله عز وجل ئاسمانەکان دادەنێ لەسەر **پەنجەیەکی**، وە زەمینەکان لەسەر **پەنجەیەکی**، وە چیاکان و خۆڵی شێدار لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دارو درەخت و ئاو لەسەر **پەنجەیەکی**، وە دروستکراوەکانی تر لەسەر **پەنجەیەکی**، پاشان دەفەرمووێ: من پادشام، رسول الله (ﷺ) پێکەنی هەتا ددانە چوارینەکانی دەرکەوت، پاشان خوێندیەوە: { وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ } [سورة الزمر: ٦٧] هەتا کۆتایی ئایەتەکە.

٢٨- له أخيه عبدالله بن الحارث بن نوفل، له باوكيەوه، گووتی: رسول الله (ﷺ) فەرموويەتی: بێگومان الله جل جلاله سێ شتی بە **دەستی** خۆی دروست كردووه: ئادەمی دروستكرد بە **دەستی**، وە تەوراتی نووسی بە **دەستی**، وە فردەوسی دروست كرد بە **دەستی**.

٢٩- عبدالله بن عمرو (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەيگووت: بيستم رسول الله (ﷺ) دەيفەرموو: دڵەكانی بەنی ئادەم هەمووی لەنێوان **دوو پەنجە** لە **پەنجەكانی** الرحمن عز وجل دايە وەک يەک دڵ، چۆنی بوێت هەڵی دەسوڕێنێ.

پاشان رسول الله (ﷺ) فەرمووی: يا الله ئەی هەڵسوڕێنەری دڵەكان، دڵەكانمان هەڵسوڕێنە لەسەر تاعەت و عيبادەتی خۆت.

## جێگیرکردنی ( پێکەنین بۆ الله تعالی )

٣٠- له أبي رزين (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) كه رسول الله (ﷺ) فەرموویەتی: پەروەردگارمان سبحانه وتعالی **پێکەنی** به نائومێدی بەندەکانی و نزیکبوونەوەی گۆڕانی حاڵی.
أبي رزين دەڵێ: گووتم: واته پەروەردگار جل جلاله پێدەکەنێت ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ.
گووتم: بێبەش نابین له خێری پەروەردگارێک که پێبکەنێت.

٣١- له أبي هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) ئەویش له پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: الله **پێکەنی** به دوو پیاو یەکیان هاوەڵەکەی کوشت دواتر هەردووکیان چوونە بەهەشتەوە.

عبدالرحمن گووتی: پرسیم له الزهري له تەفسیری ئەمە فەرمووی: موشریکێک مسوڵمانێک دەکوژێت [موسڵمانەکە دەچێتە بەهەشت] دواتر موسڵمان بوو دواتر مرد جا چووە بەهەشتەوە.

٣٢- إبن جريج دەگێڕێتەوە، له أبي الزبير، که بیستویەتی جابر پرسیاری له الورود کردووە ... ، فەرموودەکەی بۆ باسکرد.

وە تێیدا گووتی: الله عز وجل دەفەرموێت: من پەروەردگاری ئێوەم، دەڵێن: [باوەڕت پێناکەین] تا سەیرت دەکەین، جا خۆی دەردەخات بۆیان **پێدەکەنێت**.

گووتی: بیستم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جا دەیانبات و شوێنی دەکەون، وە هەموو مرۆڤێک موناڧق یان ئیماندار نورێکی دەدرێتێ.

رواه مسلم في الإيمان، عن عبيدالله، وإسحاق بن منصور، عن روح، عن عبادة، عن ابن جريج موقوفا.

٣٣- أبي الزبی گووتی: پرسیم لە جابر لە الورود ؟ گووتی: بیستم رسول الله (ﷺ) دەیفەرموو: الله تعالى بۆیان دەردەکەوێت بە **پێکەنینەوە**.

٣٤- لە أبي موسى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: پەروەردگارمان دەردەکەوێت بۆمان بە **پێکەنینەوە**.

## جێگیرکردنی ( کورسی شوێن پێی الله یە و دەنگی کورسی )

٣٥- إسرائيل گێڕایەوە، لە أبي إسحاق لە عبدالله بن خليفة، لە عمر (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) گووتی: ئافرەتێک هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) پێی گووت: داوام بۆ بکە لە الله تعالى کە بمخاتە بەهەشتەوە ؟ جا پەروەردگاری بە گەورە دانا [واتە باسی گەورەیی پەروەردگاری کرد] وە فەرمووی: بێگومان **کورسی** الله ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە، وە **دەنگی** لێوە دێت وەک دەنگی بار هەڵگرێکی تازە کاتێک سەر دەکەوی و لەبەر قورسایی دەنگی لێوەدێ. [کورسیش دەنگی دێ کاتێک الله تعالى دەچێتە سەری لەبەر قورسایی الله تعالى دەنگی لێوە دێت، والله اعلم].

٣٦- أبو عاصم الضحاك بن مخلد دەگێڕێتەوە، لە سفيان، لە عمار الدهني، لە مسلم البطين، لە سعيد بن جبير، لە ابن عباس (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) شجاع ئەم فەرموودەی بەرز کردەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) [واتە گووتی ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ] بەڵام الرمادي بەرزی نەکردەوە [واتە گووتی ئەمە وتەی ابن عباس] ـە. (وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ) [البقرة: ٢٥٥]، فەرمووی: **کورسی** جێگای هەردوو پێی الله تعالى یە، وە هیچ شتێک ئەندازە ناکرێ بە ئەندازەی عەرش. [واتە کەس ئەندازەی عەرش نازانێ جگە لە الله خۆی نەبێت].

٣٧- محمد بن مخلد بۆی گێڕاینەوە، گووتی: محمد بن الحساني بۆی گێڕاینەوە گووتی: وكيع بۆی گێڕاینەوە، گووتی: سفيان بۆی گێڕاینەوە، بە ئیسنادێکی لەم شێوەیە. [واتە بە هەمان شێوەی پێش خۆی].

٣٨- له جوبەیری كوڕی مطعم ـەوە له باوكیەوە، له باپیریەوە، گووتویەتی: عەرەبێكی دەشتەكی هاتە خزمەت پێغەمبەری الله (ﷺ) گووتی: ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) خەڵكەكە كەوتوونەتە زەحمەت و ناڕەحەتیەوە، خاو خێزان و منداڵان فەوتان و تیاچوون ، ئاژەڵ و ماڵات فەوتان و له ناوچوون، ماڵ و سامان كەمی كردوو بەرەو نەمان دەچێت، داوا بكە له الله تعالى بارانمان بۆ ببارێنێ، ئێمە تۆ دەكەینە تكاكار لای الله تعالى، الله تعالى ـش دەكەینە تكاكار لەلای تۆ، پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرمووی: هاوار بۆ تۆ !! ئەوە تۆ دەزانی دەڵێی چی ؟ پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەوەندە (سُبْحَانَ اللّٰه) ی كرد هەتا هاوەڵان زانیان كه توڕە بووە له قسەی كابرای دەشتەكی بۆیە ئەوانیش ترسان بە ڕوخساریاندا دەزانرا، له پاشاندا فەرمووی: وەیل بۆت بەڕاستی الله ناكرێتە تكاكار لەسەر هیچ یەكێك له دروستكراوەكانی، الله لەوە گەورەترە، وەیل بۆ تۆ دەزانی الله چییە ؟ بەڕاستی عەرشەكەی لەسەر ئاسمانەكان و زەویەكەی ئەوهایە - وهب ئەوهای نیشاندایـن - وە گووتی وەك قوببەیەك - وە ئەو جیڕەی پێ دەكا وەك جیڕەی [كەژاوەی پشتی وڵاخ] بە سوارەكەی.

٣٩- له جوبەیری كوڕی مطعم ـەوە له باوكیەوە، له باپیریەوە، گووتویەتی: عەرەبێكی دەشتەكی هاتە خزمەت پێغەمبەری الله (ﷺ)، گووتی: ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) خەڵكەكە كەوتوونەتە زەحمەت و ناڕەحەتیەوە، خاو خێزان و منداڵان فەوتان و تیاچوون، ئاژەڵ و ماڵات فەوتان و له ناوچوون، ماڵ و سامان كەمی كردوو بەرەو نەمان دەچێت، داوا بكە له الله تعالى بارانمان بۆ ببارێنێ، ئێمە تۆ دەكەینە تكاكار لای الله تعالى، الله تعالى ـش دەكەینە تكاكار لەلای تۆ، پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرمووی: هاوار بۆ تۆ !! ئەوە تۆ دەزانی دەڵێی چی ؟ پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەوەندە (سُبْحَانَ اللّٰه) ی كرد هەتا هاوەڵان زانیان كه توڕە بووە له قسەی كابرای دەشتەكی

بۆیە ئەوانیش ترسان بە ڕوخسارياندا دەزانرا، لە پاشاندا فەرمووی: هاوار بۆت بەڕاستی الله ناكرێتە تكاكار لەسەر هیچ یەكێک لە دروستكراوەكانی، الله لەوە گەورەترە، وەیل بۆ تۆ دەزانی الله چییە ؟ بەڕاستی عەرشەكەی لەسەر ئاسمانەكان و زەویەكەی ئاواو ئاوایە، وە بە پەنجەكانی ئاماژەی پێ كرد وەک قوببەیەک، وە ئەو جیرەی پێ دەكا وەک جیڕەی [كەژاوەی پشتی وڵاخ] بە سوارەكەی.

قال الرمادي: أما علي بن المديني فلم يتمه لنا ، انتهى إلى قوله: لا يستشفع بالله على أحد من خلقه، وأتمه لنا يحيى بن معين، وكتب لي يحيى بن معين بخطه، واللفظ لابن مخلد. وكذلك رواه حفص بن عبد الرحمن عن محمد بن إسحاق بهذا الإسناد. ومن قال فيه: عن يعقوب بن عتبة، بن وهم والصواب: عن جبير بن محمد كما ذكرنا، ها هنا.

## دڵی بەندەکان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الله و جێگیرکردنی (پەنجە بۆ الله تعالی)

٤٠- فضيل بن عياض دەگێڕێتەوە ، لە سليمان - واتە - الأعمش ، لە أبي سفيان، لە أنس بن مالك (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) گووتی: رسول الله (ﷺ) دەیفەرموو: ئەی ڕاگری دڵەکان دڵم جێگیر بکە لەسەر دینەکەت. پێیان گووت: یا رسول الله (ﷺ) بۆ ئێمە دەترسی، لەکاتێکدا بڕوامان پێت هێناوە، وە دڵنیاین لەوەی پێی هاتووی ؟ فەرمووی: من چوزانم، بەڕاستی دڵی دروستکراوەکان لە نێوان دوو **پەنجە** لە **پەنجەکانی** الله عز وجل دایە.

٤١- جابر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) گووتی: رسول الله (ﷺ) زۆر جار دەیفەرموو: ئەی ڕاگری دڵەکان دڵم جێگیر بکە لەسەر دینەکەت.
هەندێک لە ئەهلەکەی پێیان ووت: ئایا بۆ ئێمە دەترسی لەکاتێکدا باوەڕمان پێت هێناوە، وە بەوەش پێی هاتووی ؟
فەرمووی: بێگومان دڵەکان لە نێوان دوو **پەنجە** لە **پەنجەکانی** الرحمن عز وجل دایە، ئەو دەڵێت ؟ وە أبو أحمد پەنجەی دەجوڵاند.

٤٢- أنس بن مالك (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) گووتی: رسول الله (ﷺ) زۆر جار دەیفەرموو: پەروەردگارا دڵم جێگیر بکە لەسەر دینەکەت، هەندێک لە هاوەڵەکانی پێیان گووت: یا رسول الله (ﷺ) بۆ ئێمە دەترسی، کە بڕوامان پێت هێناوە، وە بە ڕاستت دەزانین لەوەی پێی هاتووی ؟
فەرمووی: بەڵێ، بێگومان دڵەکان لە نێوان دوو **پەنجە** لە **پەنجەکانی** الرحمن عز وجل دایە دەیان سوڕێنێتەوە، وە رسول الله (ﷺ) فەرمووی بەهەمان شێوە، وە

ئاماژەی دەکرد بە پەنجەی. [ئەم ئاماژە کردنە بۆ پەنجەکانی خۆی مەبەست لەوە نییە کە پەنجەی الله تعالى ی شوبهاندووە بە پەنجەی خۆی، پەنا بە الله، بەڵکو مەبەستی ڕوونکردنەوە بووە بۆ هاوەڵەکانی، والله اعلم].

٤٣- إدريس الخولاني گووتی: بیستم النواس بن سمعان الكلابي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەیگووت: بیستم رسول الله (ﷺ) دەیفەرموو: هیچ دڵێک نییە ئیللا لە نێوان دوو **پەنجە** لە **پەنجەکانی** پەروەردگاری جیهانیانە، ئەگەر بیەوێت جێگیری دەکات و بەردەوامی پێ دەبەخشێ لەسەر هیدایەت، وە گەر ویستیشی گومڕای بکات گومڕای دەکات.
گووتی: وە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: ئەی ڕاگری دڵەکان جێگیرمان بکە لەسەر دینەکەت، وە تەرازوو بە دەستی الرحمن ـە عز وجل نزمی دەکاتەوەو و بەرزی دەکاتەوە.

وە العباس گووتی: لە نێوان پەنجەکانی الرحمن ـە عز وجل ئەگەر بیەوێ جێگیری دەکات وە گەر ویستیشی گومڕای بکات گومڕای دەکات.
هەروەها گووتی: دڵەکانمان جێگیر بکە لەسەر دینەکەت، وە تەرازوو بە دەستی الرحمن ـە، تایەکانی بەرز دەکاتەوە، وە نزمی دەکاتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت.

## جێگیرکردنی ( وێنە یان شێوە بۆ الله تعالى )

٤٤- أبي هريرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەڵێ: رسول الله (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان لە یەکێکی تری دا ئەوە با خۆی بە دوور بگرێ لە ڕوخساری، وە پێی نەڵێت: الله ڕووت ڕەش بکات، وە ڕووی ئەو کەسەش کە ڕووی لە ڕووی تۆ دەچێ، لەبەر ئەوەی الله عز وجل دروستی کردووی لەسەر **وێنەی خۆی**. [ واتە آدم علیه السلام لەسەر وێنەی الله تعالى دروست کراوە ].

٤٥- ابن عمر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) گووتی: رسول الله (ﷺ) فەرمووی: ڕووخسارەکان بە ناشرین مەزانن [مەڵێن الله ناشرینت کا]، چونکە الله عز وجل آدم ی (علیه السلام) لەسەر **وێنەی خۆی** دروستکردووە. [ واتە آدم علیه السلام لەسەر وێنەی الله تعالى دروست کراوە ].

٤٦- لە أبي هريرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرمووێت: ئەگەر یەکێکتان لە یەکێکی تری دا ئەوە با خۆی بە دوور بگرێ لە ڕوخساری، وە پێی نەڵێت: الله ڕووت ڕەش بکات، وە ڕووی ئەو کەسەش کە ڕووی لە ڕووی تۆ دەچێ، چونکە الله عز وجل آدم ی (علیه السلام) لەسەر **وێنەی خۆی** دروستکردووە.

٤٧- لە أبي هريرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: الله عز وجل آدم ی (علیه السلام) لەسەر **وێنەی خۆی** دروستکردووە ، وە درێژییەکەی ٦٠ باڵ بووە. [ واتە درێژی آدم ٦٠ باڵ بووە ].

٤٨- ابن عمر (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) گووتی: رسول الله (ﷺ) فەرمووی: ڕووخسارەکان بە ناشرین مەزانن [مەڵێن الله ناشرینت کا]، چونکە الله آدم ی (علیه السلام) لەسەر وێنەی الرحمن عز وجل دروستکردووە.

٤٩- أبي هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) گووتی: رسول الله (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان لە یەکێکی ترتانی دا با لە ڕوخساری دوور کەوێتەوە، چونکە **وێنەی مرۆڤ** لەسەر **وێنەی الرحمن ـە** عز وجل.

## جێگیرکردنی ( مشت بۆ الله تعالى )

٥٠- محمد بن زياد گووتی: بیستم أبا أمامة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەیگووت: بیستم رسول الله (ﷺ) دەیفەرموو: پەروەردگارم بەڵێنی پێ داوم کە حەفتا هەزار لە ئوممەتەکەم بەبێ لێپرسینەوە و سزادانیان بیان خاتە بەهەشتەوە، لەگەڵ هەر هەزارێک حەفتا هەزاری تری لەگەڵدایە، وە سێ **مشتیش** لە **مشتەکانی** پەروەردگارم.

٥١- أبو محمد بن صاعد بۆی گێڕاینەوە، خوێندییەوە تێیدا، گووتی: محمد بن حرب بواسط بۆی گێڕاینەوە، يزيد بن هارون بۆی گێڕاینەوە، گووتی: إسماعيل بن عياش هەواڵی پێداین، لە محمد بن زياد، لە أبي أمامة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هەمان فەرموودەی پێشوو. [سەیری آثري ٥٠ بکە].

٥٢- إبن صاعد هەواڵی پێداین، گووتی: أبو أيوب النهراني بۆی گێڕاینەوە، گووتی: عبدالله بن عبدالجبار بۆی گێڕاینەوە، گووتی: إسماعيل بۆی گێڕاینەوە، گووتی: محمد بن زياد بۆی گێڕامەوە، لە أبي أمامة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هەمان فەرموودەی پێشوو. [سەیری آثري ٥٠ بکە].

٥٣- إبن صاعد هەواڵی پێداین خوێندیەوە، گووتی: محمد بن عمرو بن حيان و أبو عتية أحمد بن الفرج بۆیان گێڕاینەوە، گووتیان: بقية بن الوليد بۆی گێڕاینەوە، گووتی: ابن زياد بۆی گێڕامەوە، لە أبي أمامة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) یان لە پیاوێک لە هاوەڵانی رسول الله (ﷺ) فەرمووی: پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم کە بیانخاتە بەهەشتەوە لە ئوممەتەکەم ... تا کۆتایی باسی کرد بەهەمان فەرموودەی پێشوو. [سەیری آثري ٥٠ بکە].

٥٤- إبن صاعد هەواڵی پێداین، گووتی: محمد بن عوف بۆی گێڕاینەوە، گووتی: سليم بن عثمان بۆی گێڕاینەوە، لە محمد بن زياد، لە أبي أمامة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم کە لە ئوممەتەکەم بخاتە بەهەشتەوە ... پاشان بە هەمان شێوە باسی کرد تا کۆتایی فەرموودەکە. [سەیری آثري ٥٠ بکە].

٥٥- القاسم بن محمد گووتی: بیستم أبا هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) گووتی: رسول الله (ﷺ) فەرمووی: بێگومان الله عز وجل خێرو چاکە قەبوڵ دەکات، وە وەری دەگرێ بە **دەستی ڕاستی**، وە خێرەکەیان بۆ پەروەردە دەکات وەک چۆن یەکێ لە ئێوە جوانووی ماینێ یان پارینە وشترێ پەروەردە دەکات، تا وەک شاخی ئوحودی لێ دێت.

وە بەڕاست دانانی ئەمە لە کتابی الله تعالى (وَيَأۡخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ) [التوبة: ١٠٤] (يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِ) [البقرة: ٢٧٦].

أخرجه البخاري في التوحيد.

٥٦- لە أبي هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: کەسێک چاکەیەک ناکا لە کەسابەتێکی پاک، وە الله هیچ وەرناگرێت ئیللا پاک نەبێت، ئیللا دەیخاتە ناو **لەپی** الرحمن تبارك وتعالى، وە الله بۆ هەر یەکێکتان خێرو چاکەکە پەروەردە دەکات هەر وەکو یەکێ لە ئێوە جوانووی ماینێ یان پارینە وشترێ، یان گەوهەرەکەی، تا تەواو گەورە دەبێت وەکو شاخی ئوحود.

## مەنهەجی سەلەف لە جێگیرکردنی فەرموودەکانی سیفاتی الله تعالی دا

٥٧- محمد بن مخلد بۆی گێڕاینەوە گووتی: العباس بن محمد الدوري بۆی گێڕاینەوە، گووتی: بیستم أبا عبید القاسم بن سلام، باسی بابێکی دەکرد تێیدا ڕیوایەت هاتووە لەسەر بینینی الله، وە کورسی شوێن هەردوو پێی الله ـیە، وە پەروەردگارمان پێکەنی بە نائومێدی بەندەکانی و نزیکبوونەوەی گۆڕانی حاڵی، وە پەروەردگارمان لە کوێ بووە پێش ئەوەی ئاسمانەکان دروست بکات، وە کاتێک دۆزەخ پڕ نابێ هەتا پەروەردگار پێی دەخاتە ناوی، ئەویش دەڵێت: تەواو تەواو یان بەسە بەسە پڕ بووم، وە لە شێوەی ئەم فەرموودانە ؟

أبا عبید فەرمووی: ئەم فەرموودانە صحیحن هەڵیان گرتووە هاوەڵانی فەرموودە وە فوقەهاکان هەندێکیان لە هەندێکی تریان، وە ئەمە لای ئێمە حەق و ڕاستە هیچ گومانێکی تێدا نییە، بەڵام ئەگەر گووترا: چۆن الله پێی دەخاتە ناو دۆزەخ، وە چۆن پێدەکەنێت ؟ **پێیان دەڵێین: تەفسیری ئەمە ناکەین وە نەشمان بیستووە هیچ یەکێک تەفسیری بکات.** [ واتە باوەڕمان پێی دەبێت وەک چۆن هاتووە لەسەر ڕووکەشەکەی بەبێ تەئویل یان تمثیل یان تشبیهـ بە شێوازێک کە شیاوی الله تعالی بێت ئەوەش تەنها خۆی دەزانێ، والله اعلم ].

٥٨- محمد بن مخلد بۆی گێڕاینەوە گووتی: العباس بن محمد الدوري بۆی گێڕاینەوە، گووتی: بیستم یحیی بن معین دەیگووت: شاهێدم زکریا بن عدي پرسیاری لە وکیع کرد ؟ پێی گووت: ئەی باوکی سفیان ئەم فەرموودانە، واتە وەکو: کورسی شوێن هەردوو پێی الله تعالی یە، وە هاوشێوەی ئەمە ؟ **وکیع گووتی: گەیشتووم بە إسماعیل بن أبي خالد، وە سفیان، وە سلیمان، ئەم فەرموودانەیان دەگێڕایەوە وە هیچ شتێکیان لێ تەفسیر نەدەکرد.** [ واتە وەک ئەوەی هاتووە وەریان گرتووەو باسی چۆنیەتیەکەیان نەکردووە چونکە ئەوە تەنها الله خۆی دەزانێ کە چۆن چۆنییە، والله اعلم ].

٥٩- محمد بن مخلد بۆی گێڕاینەوە گووتی: محمد بن إسحاق الصاغاني بۆی گێڕاینەوە، گووتی: محمد بن سلیمان لوین بۆی گێڕاینەوە، گووتی: گووترا بە سفیان بن عیینة: ئەم فەرموودانەی کە هاتووە دەربارەی بینینی الله تعالی ؟ **فەرمووی: حەقە لەسەرمان لەوەی گوێمان لێی بووە و لەوانەی متمانەمان بە زانستیانە و وە پێیان ڕازین.**

٦٠- محمد بن مخلد بۆی گێڕاینەوە گووتی: الحسن بن الفضل بن السمح بۆی گێڕاینەوە، گووتی: بیستم أحمد بن أبي شریح، گووتی: بیستم وکیع دەیگووت: وە فەرموودەیان دەگێڕایەوە لە بارەی بینینی الله تعالی، یان غەیری ئەوە، **گووتی: هەر کەسێکتان بینی ئینکاری ئەم فەرموودانەی دەکرد لە جەهمیەکان بیانژمێرن.**

٦١- محمد بن مخلد بۆی گێڕاینەوە گووتی: عیسی بن إسحاق بن موسی الأنصاري أبو العباس گووتی: بیستم باوکم دەیگووت: **بیستم سفیان بن عیینة دەیگووت: هەموو وەسفێک کە الله وەسفی خۆی کردووە لە قورئان، خوێندنەوەکەی تەفسیرەکەیەتی نە چۆنیەتی و نە نموونە.** [واتە وەردەگیرێ لەسەر ڕووکەشەکەی باسی چۆنیەتیەکەی ناکرێت وە ناچوێنرێ بە هیچ یەکێک لە دروستکراوەکانی، والله اعلم].

٦٢- محمد بن مخلد بۆی گێڕاینەوە گووتی: إسحاق بن یعقوب العطار بۆی گێڕاینەوە گووتی: بیستم أحمد بن الدورقي، دەیگووت: **بیستم وکیع دەیگووت: تەسلیمی ئەم فەرموودانە دەبین هەر وەک ئەوەی کە هاتووە، وە ناڵێین: ئەمە چۆنە ؟ وە ئەمە چۆن هاتووە ؟.**

٦٣- محمد بن مخلد بۆی گێڕاینەوە گووتی: أبو العباس إسحاق بن یعقوب بۆی گێڕاینەوە گووتی: أحمد إبن الدورقي دەیگووت: أحمد بن نصر رحمه الله بۆی گێڕامەوە، گووتی: بیستم سفیان بن عیینة وە من لە ماڵەکەی بووم لە دوای سێیەکی سەرەتای شەو، زۆر داوام لێکرد لە مەسەلەیەک تا جوابم داتەوە، گووتی: وازم لێبێنە هەناسە بدەم.
پێم گووت: ئەی باوکی محمد من دەمەوێ پرسیارت لێ بکەم لە شتێک ؟ گووتی: پرسیار مەکە، پێم گووت: پێویستە لێت بپرسم، ئەگەر لە تۆی نەپرستم ئەی لە کێی بپرسم ؟
گووتی: پرسیارەکەت بکە، پێم گووت: فەرموودەی عبیدة لە عبدالله، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) چۆن چۆنییە: بەڕاستی الله عز وجل ئاسمانەکان هەڵدەگرێت لەسەر پەنجەیەکی، وە زەویەکان لەسەر پەنجەیەکی.

وە فەرموودەی: بێگومان دڵی بەنی آدم لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الرحمن دایە. وە فەرموودەی: بەڕاستی الله عز وجل سەرسام دەبێت، وە پێدەکەنێت بە کەسێک ئەوەی زیکری دەکات کاتێ لە خەو هەڵدەستێ ؟

**سفیان فەرمووی: ئەمانە وەک ئەوەیە کە هاتووە، ئیقراری پێ دەکەین، وە دەیگێڕینەوە بەبێ چۆنیەتیەکەی.**

٦٤- محمد بن مخلد بۆی گێڕاینەوە گووتی: محمد بن محمد بن عمر بن الحکم أبو الحسن بن العطار بۆی گێڕاینەوە گووتی: بیستم محمد بن مصعب العابد، دەیگووت: **ئەوەی وا بانگەشە بکات کە تۆ (مەبەستی پەروەردگارە) قسە ناکەیت و نابینرێی لە قیامەت، ئەوە کافرە بە ڕوخسارت، وە تۆ ناناسێ، شایەتی دەدەم کە تۆ لەسەر عەرشی، لە سەرووی حەوت ئاسمانەکان، نەک هاوشێوەی ئەو دوژمنە زەندیقانەت دەیڵێن.**

٦٥- عباد بن العوام گووتی: شریک بن عبدالله هاتە لای ئێمە، پێمان گووت: ئەی باوکی عبدالله لێرە لای ئێمە کەسانێک لە موعتەزیلەکان ئینکاری ئەم فەرموودانە دەکەن، کە الله عز وجل دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا.
وە کە ئەهلی بەهەشت پەروەردگاریان دەبینن، شریک (دە) فەرموودەی هاوشێوەی ئەم فەرموودانە گێڕایەوە بۆمان، وە گووتی: ئەمما ئێمە دینەکەمان وەرگرتووە لە کوڕەکانی تابعین، ئەوانیش لە هاوەڵانی رسول الله (ﷺ) ئەی ئەوان لە کێیان وەرگرتووە ؟.

٦٦- محمد بن مخلد بۆی گێڕاینەوە، گووتی: أبو عبدالله بۆی گێڕاینەوە، گووتی: روح بن أبي سعيد، گووتی: بيستم أبا رباب عقبة بن قبيصة بن عقبة، گووتی: ڕۆژێکیان چووین بۆ لای أبا نعيم، جا هاتە خوارەوە بۆ لامان لەسەر ئەو پلیکانەیەی لە ماڵەکەیدایە، وە دانیشت لە نێوانمان وەک ئەوە وابوو کە تووڕە بێت، دەستپێکی قسە گووتی: سفيان بن سعيد بن مسروق الثوري بۆی گێڕاینەوە، وە زهير بن معاوية بن حديج بن رحيل الجعفي بۆی گێڕاینەوە، وە حسن بن صالح بن حي بۆی گێڕاینەوە، وە شريك بن عبدالله النخعي بۆی گێڕاینەوە، ئەمانە کوڕەکانی کۆچەریەکانن قسەیان دەکرد و دەیان گێڕایەوە کە الله عز وجل دەبینرێ لە ڕۆژی دوایدا، هەتا کاتێک ئەم کوڕی یەهودی بۆیاخ چییە هات و بانگەشەی ئەوەی کرد کە الله نابینرێ – واتە: بشر المريسي [سەرە گەورەی جەهمیەکان بوو بشر المريسي].

٦٧- الوليد بن مسلم گووتی: پرسیم لە الأوزاعي، وە مالک بن أنس، وە سفيان الثوري، والليث بن سعد لە بارەی ئەم فەرموودانەی کە تێیدا باسی بینین کراوە [مەبەستی بینینی الله یە لە قیامەت]، وە لە غەیری ئەمەش، **گووتیان: بیڕوێنە بێ چۆنیەتی** [واتە چۆن هاتووە بەو شێوە باوەڕی پێ دەهێنین بەبێ ئەوەی پرسیار لە چۆنیەتیەکەی بکەین، والله اعلم].

٦٨- الدارقطني دەڵێ: ابن مخلد بۆی گێڕاینەوە، گووتی إبراهيم الزبيري بۆی گێڕاینەوە، گووتی: يحيى بن أيوب بۆی گێڕاینەوە، گووتی: عبدالله بن وهب بۆی گێڕاینەوە، لە مالک، لە الزهري، **فەرمووی: تەسلیمی سوننەت ببن وە دژایەتی مەکەن.**

